زنجیرا چیرۆکێن ئاڤاکرنا کەسایەتییا زارۆکی

# ڕەوشتێ سلاڤکرنێ



# ڕەوشتێ سلاڤکرنێ

**چیرۆك: فید براکاش**

**وێنە: هارفندەر مانکار**



**وەرگێڕان و ئامادەکرن:**

**دیان جەمیل**

زنجیرا چیرۆکێن ئاڤاکرنا کەسایەتییا زارۆکی

# ڕەوشتێ سلاڤکرنێ


چیرۆك: فید براکاش

وێنە: هارفندەر مانکار

وەرگێڕان و ئامادەکرن: دیان جەمیل

پێداچوونا زمانی: مسلم عسمەت



ژمارا سپاردنێ: 2178یا سالا 2016




# فرۆكەیا ئازادی یا كارتونی

ئازاد زارۆكەكێ بچووك بوو و قوتابی بوو ل پولا چوارێ سەرەتایی، ڕۆژەكێ دەمێ بابێ وی هاتیە مال و دیت ئازاد یێ وانەیێن خوە دخوینیت. دەمێ بابێ وی سلاڤ كرییێ ئازادی بەرسڤا وی نەدا، بابێ وی زانی ئازاد گەلەك یێ واستیایە لەورا گوتێ: كورێ من ئازاد تو چ دبێژی ئەم بچینە ناڤ باخچەی بۆ خوە یاریان بكەین؟

كەیفا ئازادی ب ڤێ چەندێ هات. ل ناڤ باخچەی بایەكێ بهێز دهات لەورا ئازادی داخواز ژ بابێ خوە كر بچنە بازاڕی بۆ وی فرۆكەیەكا كارتونی بكرن. بابێ وی ل سەر داخوازیا وی ڕازیبوو و چونە بازاڕی و فرۆكەیەك بۆ كری.



ب ڕێکێ ڤە دەمێ زڤڕین بابێ وی جیرانەکێ خوە دیت و پرسیارا ڕەوشا وی و زارۆکێن وی ژێ کر، بابێ وی گوتێ ئەز و ئازاد چووینە بازاڕی داکو فرۆکەیەکێ بۆ وی بکڕم و نوکە ئەم دێ چینە ناڤ باخچەی دا ئازاد فرۆکەیا خوە بفڕینیت.



ل وی دەمی جیرانا وان تەماشەی ئازادی کر و گوتێ: چاوانی ئازاد؟ هوسا دیارە کەیفا تە گەلەك ب ڤێ فرۆکەیێ یا هاتی؟

هزرا ئازادی ب تنێ ل سەر فرۆکەیا وی بوو کا کەنگی دێ چنە ناڤ باخچەی، لەوڕا بەرسڤا پرسیارا هەڤالێ بابێ خوە نەدا بەلکو بلەز دەستێ بابێ خوە گرت و گوتێ زووکا دا بچینە ناڤ باخچەی.



جیرانێ وان حەز ژ ڤێ ڕەفتارا ئازادی نەکر و د دلێ خوە دا گوت ئەڤ زارۆکە  گرنگیێ ب چ تشتان نادەت ب تنێ ئەو تشت نەبیت یێ وی بڤێت.

بابێ ئازادی ژی گەلەك ژ ڤێ ڕەفتارا وی تۆڕەبوو، دەمێ گەهشتینە ناڤ باخچەی گوتە ئازادی : تە بوچی بەرسڤا سلاڤا جیرانێ  مە نەدا؟ ئەڤ چەندا تە کری کارەکێ کرێت بوو ژبەرکو دەمێ کەسەك سلاڤ دکەتە تە، دڤێت تو ئێکسەر بەرسڤا سلاڤا وی بدەی و خوە ب چ تشتێن دی ڤە مژوول نەکەی داکو ئەو کەس هەست ب شەرمێ نەکەت.



جیرانێ وان ژی حەز ژ ڤێ ڕەفتارا ئازادی نەکر و د دلێ خوە دا گوت ئەڤ زارۆکە گرنگییێ ب چ تشتان نادەت ب تنێ ئەو تشت نەبیت یێ وی بڤێت.

ئازاد ژ ڤێ چەندێ پەشیمان بوو و د دلێ خوە دا گوت بابێ من ڕاست دبێژیت دڤێت من کەیفا خوە ب وی ئینابا و بەرسڤا سلاڤا وی دابا.



پشتی بێهنەکێ ئازادی و بابێ خوە یاری دناڤ باخچەی دا کرین بریار دا بزڤرنە مال و د رێکێ دا جارەکا دی جیرانێ خوە دیت کو یێ ژ بازاری دزڤریت. ل ڤێ جارێ ئازاد چوو بەراهیکا وی و سلاڤ کرێ و گوتێ: مام هندەك تشتێن خوە ب دەڤ من داکو هاریکاریا تە بکەم.

کەیفا جیرانێ وان گەلەك ب ڤێ کاری ئازادی هات و دەستخۆشی لێکر و گوتێ تە ل ناڤ باخچەی دەمەکێ خۆش بوراند؟ ئازادی بەرسڤ دا و گوتێ: بەلێ من دەمەکێ خۆش بوراند هیڤیا من ئەوە جارەکا دی تو ژی زارۆکێن خوە بینیە وێرێ و



# سەربوور

دڤێت کەسەکێ دلوڤان و تێگەهشتی بی و هەر کەسێ سلاڤ بکەتە تە تو بەرسڤا وی بدەی خوە هەکە کی بیت ژبەرکو سلاڤکرن نیشانا دلوڤانییێ یە



# داڤین و هاڤین

داڤین و هاڤین هەردوو هەڤالێن ئێك بوون ل قوتابخانێ. ڕۆژەکێ ل دەمێ وان وانەیا هونەرێ هەی داڤین زووتر هاتە د پولێ ڤە و چاکیتێ خوە ب دیواری ڤە هەلاویست داکو دەست ب کێشانا وێنەیەکێ بکەت.



هەڤالا وێ هاڤینێ ژی گەلەك حەز ژ وانەیا هونەرێ دكر لەوڕا ئەوژی دەمێ هاتیە د پولێ ڤە گەلەك یا ب كەیف بوو و ئێكسەر چاكیتێ خوە ب دیواری ڤە هەلاویست و بەرەڤ پۆلێ چوو داكو ئەوژی وێنەیەكێ بكێشیت.



کەیفا داڤینێ گەلەک هات دەمێ هەڤالا خوە هاڤین دیتی چونکی وان هەردوو گەلەک حەز ژ ڤێ وانەیێ دکر لەوڕا دەمێ هاڤین هاتیە د پۆلێ ڤە، داڤینێ سلاڤ کرێ و گوتێ چاوانی هەڤالا من یا خۆشتڤی هاڤین؟



لێ ژبەرکو هاڤین گەلەك یا بلەز بوو وێنەیەکێ بکێشیت لەوڕا بەرسڤا هەڤالا خوە داڤینێ نەدا.



ژبەر ڤێ چەندێ داڤین گەلەك خەمگین بوو و هەست ب شەرمێ کر و دلێ خوە دا گوت: دیارە ئێدی هاڤین حەز ژ من ناکەت لەورا بەرسڤا سلاڤا من نەدا.



پشتی دەمەکێ کورت هاڤینێ هەستپێکر کو وێ ژبەر لەزاتیا خوە ئاگەهـ ژ سلاڤا هەڤالا خوە داڤینێ نەبوو لەوڕا هەر ئێکسەر ل سەر ملێ خوە زڤڕی و داخوازا لێبورینێ ژ داڤینێ کرو گوتێ ببورە هەڤالا من یا خۆشتڤی من بەرسڤا سلاڤا تە نەدا ژبەرکو هندی کەیفا من ب وانەیا هونەرێ هاتبوو لەوڕا من ئاگەهـ ژ تە نەبوو.



داڤینێ گوتێ: چ نینە ئەز ل تە بوریم و تشتەکێ ئاسایی یە کو مرۆڤ ژ کەیفێن وانەیەکێ دا خوە ژ بیرڤە بکەت. هوسا هەردوو هەڤالا دوبارە سلاڤ کرە هەڤدوو پاشی پێکڤە چوون ل جهێ خوە رویشنتە خوارێ و وێنەیێن جوان نەخشاندن.

## سەربوور

هەڤالێن خوە پشت گوهـ نەهاڤێژە خوە هەکە تو چەند یێ بلەز ژی بی.



# شڤانی دڤیا یاریێ بکەت

ڕۆژەکێ کومەکا زارۆکێن هەڤالێن ئێك بریار دا بەرەڤ یاریگەهێ بچن و یاریا تەپا پێی بکەن. وان خوە ل سەر دوو گرۆپان دابەش کر و ناڤێ یانەیێن خوە کرنە یانەیا گارە و یانەیا مەتین و ل دووڤ دا وان دەست ب ئەنجامدانا یاریێ کر.



ل وی دەمی زارۆکا دەست ب یاریێ دکر و هەر ئێکی دگوتە یێ دی تەپێ بهاڤێژە بەر من. ئەو زارۆک هەمی هەڤالێن ئێك بوون و ژیێ هەمیان ژی نێزیکی ئێك بوو مالێن هەمیان ژی ل تاخەکی بوون.



کارزان ئێك ژ یاریکەرێن تیما گارە بوو و یاریکەرەکێ زیرەك بوو. دەمێ تەپە چوویە بەر پێن وی هەر ئێکسەر گولەك تومارکر.



ل وی دەمی زارۆکەکێ دی یێ هەڤاڵێ وان ناڤێ وی شڤان بوو تەماشەی زارۆکان دکر دەمێ یاری دکر. وی ژی گەلەك حەز دکر بچیت یاریێ دگەل وان بکەت لێ شەرم دکر سلاڤ بکەتە وان و بێژیتیمن ژی دڤێت یاریان دگەل هەوە بکەم.



پشتی کارزانی گول تومارکری چاڤێ وی ب شڤانی کەفت و زانی کو شڤانی ژی حەز یا هەی یاریێ دگەل وان بکەت لەورا گازی کرە شڤانی و گوتێ: چاوانی هەڤالێ مەییێ خۆشتڤی، ئەم حەز دکەین تووژی بهێی دگەل مە یاریێ بکەی.



ب ڤی ڕەنگی گەلەك كەیفا شڤانی هات و و گوت: سوپاس هەڤالێ من كارزان ب ڕاستی من ژی گەلەك دڤیا ئەز یاریێ دگەل هەوە بكەم بەش من شەرم دكر بێژمە هەوە.



گەلەك كەیفا شڤانی هات و هەست ب دلخۆشییێ کر و پاشی ئەوژی چوو دگەل تیمەکێ و دەست ب یارییێ کر و یاریکەرەکێ زیرەك بوو.

هوسا کەیفا هەمی هەڤالان پێکڤە گەلەك هات و دووباره دەست ب یاریا خوە کر و هەر ئێکی ژلایێ خوە ڤە بزاڤ دکر گولەکێ تومار بکەت.



## سەربوور

هەر کەسەك ژ مە دشێت ب ڕێکا سلاڤکرنێ گەلەك هەڤالان بۆ خوە پەیدا بکەت

